قَالَ فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ وَاقْدُرْ لِي الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ أَرْضِنِي قَالَ وَيُسَمِّي حَاجَتَهُ). (الحديث - ١١٦٦ - طرفاه في: ٦٣٨٢، ٧٣٩٠).(٥١٧)

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەستووری وابوو، بۆ هەموو کارو فرمانێ، فێری ئیستیخارە (داوای نیشاندانی خێـر)ی دەکردین، وەك چۆن فێری سوورەتەکانی قورئانی دەکردین، دەیفەرموو: ( ئەگەر یەکێکتان نیازی کارێکی هەبوو، وە نەیدەزانی باشە یا خراپە، با لەپێشا دوو ڕکات نوێژی سوننەت بکا، بلێ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي: یا فەرمووی: عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ وَاقْدُرْ لِي الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ أَرْضِنِي بِهِ:

ئەی خودایە! داوات لێ دەکەم کەبەعیلمو زانستی خۆتو دەسەڵاتو تەوانایی خۆت چاکەو خێرم نیشان بدەو ئەوەی باشە بۆم زاڵم بکە بەسەر کردنیا، وەداوای بەشو بارەو بەخششی گەورەی خۆتت لێدەکەم، چونکە تۆتوانای هەموو شتێکت هەیەو، من بێ دەسەڵاتمو تەوانام نییە، وەتۆ هەمووشت دەزانیو من نازانم، وەهەرخۆت تواناو زانای بەهەموو نهێنیو ئاشکرایەك، پەروەردگارم! تۆدەزانی ئەگەر ئەم کارە باشە بۆمن، باشە بۆدینو ئاینمو، باشە بۆژیانمو بۆ سەرئەنجامی کارم).

یافەرمووی: باشە بۆئێستامو باشە بۆ پاشەڕۆژم، ئەوا لەچارەمی بنوسەو ئاسانی بکەبۆمو لەپاشیشا پیتو بەرەکەتی تێبخەبۆم، وەتۆ دەزانی ئەگەر ئەم ئیشە خراپە بۆمن، خراپە بۆدینو ئاینموخراپە بۆگوزەرانمو بۆ

(٥١٧) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٣/٦٠ خاتمه. حديث رقم: ١١٧١ - المترجم).

سـەرئەنجامی کـارم، یافـەرموی: خراپـە بۆئێـستامو پاشـەڕۆژم، ئـەو لـەمن لادەومنـیش لەئـەولادە، وەچـی چاکە ئـەوەم لەچارەبنوسـە، لەپاشاڕازیم بکـە پێی!).

پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (وەنـاوی نیازەکەیـشی بهێنـی). واتـە: لەوێـدا کـەدەڵێی: تـۆدەزانی ئـەم کـارە...بلـێ: ...ئـەم کـارە کـەژن هێنانـە، یاخانوکڕینـە، یائەمەیـە، یائەوەیـە، باشـە بـۆمن ...تـا دوایـی. (تـاج/١/٥١٠-ب/د/ت/ن).

## سەرەوکاری دوورکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی

٥٨١- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَمْ يَكُنْ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى شَيْءٍ مِنْ النَّوَافِلِ أَشَدَّ مِنْهُ تَعَاهُدًا عَلَى رَكْعَتَيْ الْفَجْرِ. (الحديث: ١١٦٣).[٥١٨]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هـیچ سـونە تێکـی تری وەك دوورکاتە سوننـەتەکەی پێش نوێژی بەیانی ئاوابەباشـی سـەرەوکاری نەدەکردا . (ت/١/٣٠٦-ش/د).

## چی لە دوو ڕکاتە سوننەتەکەی بەیانیدا دەخوێنرێ

٥٨٢- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُخَفِّفُ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الصُّبْحِ حَتَّى إِنِّي لَأَقُولُ هَلْ قَرَأَ بِأُمِّ الْكِتَابِ. (الحديث: ١١٦٥).[٥١٩]

---

(٥١٨) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: استجاب ركعتى سنة الفجر، رقم: ٧٢٤.

(٥١٩) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: استحباب ركعتى سنة الفجر رقم:٧٢٣- المترجمه.

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندە بەگورجی دووڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی دەکرد، تەنانەت لەدڵی خۆمەوە دەم گوت: چۆن فریای خوێندنی فاتیحا دەکەوێ! (ت/١/٣٠٦-ش/د/ن).

## کردنی نوێژی چێشتەنگاو لەماڵەوە (لەئاوایی دا)

٥٨٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي بِثَلَاث، لَا أَدَعُهُنَّ حَتَّى أَمُوتَ: صَوْمِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَصَلَاةِ الضحَى، وَنَوْمٍ عَلَى وِتْرٍ.

ئەبوو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دۆستی ئازیزم پێغەمبەری خۆشەویستم (درودی خودای لەسەر بێ) ئەم سێ ئامۆژگاریەی کردوم، هەتا دەمرم تەرکیان ناکەم: لەهەموو مانگێ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبم، وەهەموو ڕۆژێ بەلایەنی کەمەوە دووڕکات نوێژی چێشتەنگاو بکەم، وەهەموو شەوێ لەپێش خەوتندا نوێژی وەتر بکەم. (ت/١/٤٨٥-ش/د/ت/ن). (الحديث: ١١٧٦ فتح الباري).[520]

## کردنی دووڕکات نوێژی سوننەتی پێش نیوەڕۆ

٥٨٤- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ -كَانَ لَا يَدَعُ أَرْبَعًا قَبْلَ الظهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْغَدَاةِ. (الحديث: ١١٨٢).[521]

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەرگیز ئەم نوێژە سوننەتانەی تەرك نەدەکرد: چوار ڕکات لەپێش نوێژی نیوەڕۆوەو دووڕکاتیش لەپێش نوێژی بەیانیەوە. (ت/١-ش/د/ت/ن).

---

(٥٢٠) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: استحباب صلاة الضحى.. رقم: ٧٢١.

(٥٢١) بڕوانە(مسلم: صلاة المسافرين وقصرها، باب: جواز النافلة قائما وقاعدا، رقم: ٧٣٠).

## نوێژی سوونه‌تی پێش شێوان

٥٨٥- عَبْدُ اللَّهِ الْمُزَنِيُّ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (صَلُّوا قَبْلَ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ قَالَ: فِي الثَّالِثَةِ: (لِمَنْ شَاءَ) كَرَاهِيَةَ أَنْ يَتَّخِذَهَا النَّاسُ سُنَّةً. (الحديث: ١١٨٣-طرفه في: ٧٣٦٨).[٥٢٢]

عه‌بدڵڵای موزه‌نی (ڕه‌زای خوای لێ بێ) له‌پێغه‌مبه‌ره‌وه ده‌فه‌رموێ: (درودی خودای له‌سه‌ر بێ) (دوورکات نوێژی سوننه‌ت، له‌پێش نوێژی شێوانه‌وه‌بکه‌ن) له‌سه‌ری جاری سێهه‌ما فه‌رمووی: (ئه‌مه‌بۆ که‌سێکه ئاره‌زوی کردنی ئه‌م نوێژه سوننه‌ته‌ی هه‌بێ). پێغه‌مبه‌ر(درودی خودای له‌سه‌ر بێ) بۆیه وای فه‌رموو، نه‌وه‌کو مه‌ردووم بیکه‌ن به‌ده‌ستورو وابزانن که‌ده‌بێ هه‌ر بکرێ.

---

(٥٢٢)لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٣/٨٥ خاتمة حديث رقم: ١١٩٧- المترجمه).

# پێرستی سەرە باسەکان

تمَّ بِحَمدِ الله